

# منداڵانی زەریا

**نووسەر: ئێدویج دانتیکاه**

وەرگێڕ: زانا شەریفیان

دەڵێن لە پشت کێوەکانەوە دیسان کێو هەیە. ئێستا لەو ڕاستییە دەگەم. هەروەها دەزانم ئاوگەلێک بوونیان هەیە هەتا هەتایی، زەریاگەلیکی بێ کۆتایی، و لەم دونیایەدا مرۆڤگەلێکی زۆر کە ناویان جگە لە خۆیان بۆ کەسی کە گرینگی نییە. سەر هەڵگەراو سەیری ئاسمان دەکەم و تۆ لەوێ دەبینم. دەبینم خەریکی وەک چاوشەیتانەی فلیقاوە دەگری. وەک کاتێک دەگری کە هاوکاریم دەکردی هەوەڵ ددانی لەقت دەربێنی. بەڵێ، ئەو ئەوکاتیش خۆشم دەویستی. نازانم بۆچی، بەڵام کاتێک سەیرم دەکردی بیری مێلووره سوورەکان دەکەوتم. خەزم دەکرد نینۆکەکانت لە پێستم ڕۆکەی و تەواوی خوێنم هەڵمژی.

نازانم تا کەی لە زەریادا دەمێنین. جگە لە من سی و شەش ئاوارەی دیکە لەسەر ئەم بەلەمە چکۆلەن. بادبانە هەڵکراوەکەمانن کوتاڵێکی سپییە بە بە پەڵەگەلی سووری ڕووناک.

کاتێک سوار بووم بیرم دەکرد ئێستاش دەتوانم بۆنی بێ تاوانی و ئاوێک کە بە تان و پۆی ئەو کوتاڵانە خوراوە، هەست کەم. سەیری سەرەوە دەکەم و لە تۆ و تەواوی ئەوکاتەی کە خۆڕاگریت دەکرد بیر دەکەمەوە. جاری وابوو هەستم دەکرد کە تۆش حەزت لێ بوو، بەڵام دەمزانی پێت خۆش بوو ڕێزت ڕاگرم. بیرت دەکردەوە خەریکم ئیرادەت تاقی دەکەمەوە. بەڵام من تەنیا دەمویست لە لات بم. ڕەنگە هەر وەک ئەوەیە کە هەمووکات دەتوت. زۆر لە خەیاڵدا دەمێنمەوە. خۆف گرتوومی کە بۆ شوێنە دوورەکان کە بڕۆین تووشی مۆتەکە بم. لەوەی کە بە درێژایی ڕۆژ تاو لەسەر دەموچاومە جاڕزم. گەر دیسان بمبینی زۆر ڕەش بووم. ئێستا کە ئێدی نیم. ڕەنگە

باوکت بتدات بە شوو. تکات لێدەکەم هەرچێک لە دەستت دێت بیکەو شوو بە سەربازێک  مەکە، ئەوان زۆر ڕەنگی مرۆڤ نانوێنن.

................................................

Haiti est comme tu las laisse

بەڵێ تۆ ڕۆیشتی و هەر ئەوەیە کە بوو. شەو و ڕۆژ فیشەک. کونی هەمیشەیی. هەموو شتێک وەک هەمیشە، من لەم هەموو  ئاڵۆزی و تێک هڵچوونانە هیلاکم. زۆر بەدفەڕ و تووڕەم لێ دەرهاتووە. کاتم بە کەوتنە دوای قالۆنچەکان بەدەوری ماڵەوە تێپەڕ دەکەم. پاشنەکانم دەدەم بەسەریاندا، زۆر ڕقم هەڵدەستێنن. هەمووشتێک تووڕەم دەکات. تەواوی ڕۆژ لەم بستە جێگایەدا کەوتووم. لەو کاتەوە کە ئەڕتش سەرکەوتووە قوتابخانەکانیان داخستووە. کەس ناوێک لە سەرۆک کۆمارە پێشووەکە ناهێنێت. باوکم تەواوی پۆستەرە ڕاگەیاندنییەکان و دوکمە کۆنەکانی سووتاند. مانمان تەواوی دوکمەکانی لە قوڵکێکی پشت ماڵەوە ناشت. مانمان خەیاڵ دەکات کە رەنگە دیسان ئەو بگەڕێتەوە. ئەو دەڵێ بە گەڕانەوەی سەرۆک کۆمار لە بن گڵەوە دەریان دێنێت. تەنانەت یەک کەسیش لە ماڵەوە ناياتە دەرێ. باوکم داوام لێ دەکات شریتی پڕۆگرامە ڕادوێیەکانی تۆ فڕێدەم. من چەن دانە شریتی مۆسیقام لە ناو بردووە، بەڵام ئێستاش دەنگی تۆم هەیە. سپاسی خودا دەکەم کە دوای ئەو ئیدی نەمایەوە. تەواوی ئەندامانی یەکێتی لاوان بێسەر و شوێن بوون. هیچ کەس هەواڵێکی لێیان نەبیستووە . بیر دەکەمەوە هەموویان لە بەندیخانە بن. ڕەنگە هەموویان مردبێتن. باوکم برێک دڵ نگەران تۆیە. ئەو هێندەش کە بیر دەکەیەوە ڕقی لە تۆ نییە. بیستم ڕۆژێک لە مانمانی دەپرسی، بیر دەکەیەوە ئەو کورە مردووە؟ مانمان گوتی لە کوێوە بزانێ. بیردەکەمەوە کە لەو هەموو خراپییە کە بەرانبەر تۆ بوویەتی پاشگەز

بووە. ئیدی شیوەی پەپوولەکانم ناکێشمەوە، چون خۆشم لە دیتنی تاویش نایات. جگە لەمانەش مانمان دەڵێ پەپوولەکان دەتوانن هەواڵ بێنن. ئەوانەی وا شێوەیەکی درەوشانەوەیان هەیە مزگێنی دێنن و ئەو ڕەشانە هەواڵی مردنمان پێ دەدەن. لە بیرت دێ دەتگوت ژیانێکی دوور و درێژمان لە پێشە؟ هەرچەنێک لەو کاتەوە تا ئێستا زۆر شت گۆڕاوە.

............................................

ژنێکی دووگیانی لاو لە نێو بەلەمەکەیە. واپێ دەچێت هاوتەمەنمان بێت. نۆزدە یان بیست ساڵ. دەم و چاوی پڕە لە شوێنە برینێک کە لە شوێن برینی تێخ دەچێت. کورتەباڵایەو ئاوازی دەنگی من بیری دێهاتییەکانی باکوور دێنێتەوە. زۆرینەی ئەوانەی سواری بەلەمەکەن لە من بەتەمەن ترن. بیستوومە لە نێو زۆری ئەم بەلەمانە منداڵان سوار دەبن. دڵ خۆشم کە لەمەدا منداڵێک سووار نەبووە. گومان دەکەم بینینی ڕۆژانەی کچ و کوڕە منداڵ کارەکان لە سەر ئەم زەریایە، بینینی سیمای بێ هەستییان کە مرۆڤ بیری بێ هیوایی لە داهاتووی وڵات دەخات. ئازاری دەدام. بۆ گەڕاوەکان بە ئەنازە دژوارە. بۆ منیش هەروەها. بەرلەوەی کە ناچار بم بۆ تاقیکارییەکانی زانکۆ بەردەوام بخوێنم، سەبارەت بە ئامریکا زۆرم خوێندبووە. خەریکم بیرم دەخەمە کار بزانم سەبارەت بە مەیامەی چ شتێکم خوێندبووە. کەش و هەوای خۆرەتاوە. لەوێ بەفر وەک شوێنەکانی دیکەی ئامریکا نابارێت. ڕوون نییە بە تەواوەتی تا ئەوێ چەندە نێوانمان هەیە. ڕەنگە تەنیا لە کەنارەکانی خۆمان دوور کەوتبێتیەنەوە. لە زەریادا هیچ هێڵێکی سنووری بوونی نییە. هەموو شتێک لەیەک دەچن. تەنانەت مرۆڤ دوودڵە کە نەکا خەریکەن لەسەر زەوی دەکەوینە خوارەوە. ڕەنگە دونیا تەختەو ئێمەش وەک مەلەوانە کۆنەکان دەمانهەوێت لێی تێ بگەین. دەزانی کە زۆر سەر بەدین نیم. هەرچەن هەموو شەوێک دەپارێمەوە تووشی فەرتەنە نەبین. کاتێک کە دەتوانم

بخەوم، خەون دەبینم کە فەرتەنە وەدوای فەرتەنەیە کەوتووینەتە داوی. خەون دەبینم کە با کان لە ئاسمان هاتوون و ئێمە بەرەو زەریا ڕادەکێشن، ئێمە دەکەوینە بنەوەو ئیدی هەواڵێک لە ئێمە نابێت.

ئێستا لەگەڵ بیری مردن باشتر ڕێهاتووم. نە ئەوەی کە بە تەواوەتی قەبووڵم کردبێت. بەڵام دەزانم ئەگەری هەیە پێش بێت. هەڵە مەکە. بەڕاستی نامهەوێت شەهید بم. دەزانم مردووم بەکەڵکی کەس نایات، بەڵام گەر چۆن شتێک بیهەوێت پێش بێت، دەزانم ناتوانم تەنیا هەراکەم و پێی بڵێم بڕۆ.

خۆزگە تاقمێکی دیکە لە لاوەکان بتوانن پڕۆگرامە ڕادوێیەکان بەڕێوە ببن. ئەو پڕۆگرامە ڕادیۆییە بۆ ماوەیەکی زۆر تەواوی ژیانم بوو. باش بوو کە بۆ ماوەیەک ڕادوێیەکی چۆنهات ببێت، جێگایەک بوو کە دەمانتوانی بڵێین چ مان لە دەوڵەت دەوێت، بۆ داهاتووی وڵاتمان چیمان دەوێت.

ڕێژەیەکی زۆر لە پڕۆتێستانەکان سواری ئەم بەلەمەن. زۆرینەیان خۆیان بە ئەیوب یان بەنی ئیسرائیل دەزانن. گومان دەکەم بڕێکیان بەو هیوان کە لە ناکاو لە ئاسمانەوە شتێک بێتە خوارەوەو زەریاکەمان بۆ هەڵدڕێت. ئەوان دەڵێن کە خودا دەبەخشێت و خودا دەیگرێتەوە. بە من کە هیچکات شتێکی وای نەبەخشیوە. چی بوو کە بیگرێت؟

......................................

چی دەبوو گەر دەمتوانی بکوژم. گەر چەن وانگای(2) باشم دەزانی، لەم ڕۆژگارە دەمسڕینەوە. ئەمرۆ بەردەم بەندیخانەی فۆڕت دیمانش(3) تەقەیان لە گروپێک لە خوێندکارەکان کرد. ئەوان بە بۆنەی مەیتەکانی ڕادوێ شەش خۆپیشاندانیان دەکرد. ئەمە ناوێکە لەسەر ئێوە دایانناوە. ڕادوێ شەش.ناوبانگت دەرکردووە. زۆرکەس وا

بیر دەکەنەوە تۆش وەک ئەوانی دیکە مردوویی. ئەوان دەیانهەوێت مەیتەکان بە بنەماڵەکانیان بگەڕێتەوە. ئەمڕۆ نیوەڕۆ لە کۆتایی دا ئەڕتش چەنێک لە مەیتەکانی داوە. ئەوان بە بنەماڵەکانیان گوت بچن مەیتەکانتان لە ژووری هەژاران لە ساردخانە هەڵگرنەوە. هاوسێی ئێمە مادان ڕۆژر(4) بە سەری کوڕەکەیەوە بۆ ماڵەوە گەڕایەوە. بەخودا ڕاستە، تەنیا سەری بوو. دەڵێن لە سارخانە ماشێنێک بەسەری دا ڕۆیشتووە سەری لێبۆتەوە. کاتێک مادان ڕۆژر ڕۆیشتبووە ساردخانەکە، سەرەکەیان پێ دابوو. کاتێک دیم، سەرەکەی هەڵگرتبوو سەرانسەری پڕتۆپڕەنس گەڕابوو. تەنیا پیشان بدات چییان لە کوڕەکەی کردووە. ماکوتەکان(5) لە تەنیشتی ماڵەوە پێی پێدەکەنان. لێیان پرسی ئەوە شێوەکەیەتی. بە زۆری دە کەس پێشیان پێ گرت کە ئاوقایان نەبێت. هیچ و پووچەکان دەیانکوشت. من ئیدی نارۆمە دەرەوە. بەچەشنی کەلاکخۆرەکان دایمە سەیرت دەکەن. کە دەبێتە شەو ناتوانم بخەوم. لە تاریکیدا فیشەکەکان دەژمێرم. ئێستاش بڕواناکەم کە ڕاستی بێت. بەڕاستی ڕۆیشتی؟ بریا ڕێگایەک هەبایە کە ئەرخەیان بین ڕۆیشتوویی. بەڵێ، دەنووسم. هەر ئەو جۆرەی کە بەڵێنمان بە یەک داوە ، بەردەوام دەنووسم. بێزارم لێی، بەڵام لە نووسین دەست هەڵناگرم. تۆش بەردەوام بنووسە، باشە؟ کاتێک یەکتریمان دی، دەڵێی هیچ کاتێکمان بە فیڕۆ نەچووە.

....................................

ئەمڕۆ هەوەڵ ڕۆژی ڕاستەقینەمان لە زەریادا بوو. هەرکەس و بە جوڵەیەکی چکۆلەی بەلەمەکە، خەریک هەڵی دێناوە. هەوەڵ چین لە خۆر سووتاوی دەم و چاوی دەور و بەریەکانم خۆی نواند. پیاوێک گوتی: ئێستا ئیدی ئێمە لەگەڵ کوبایی بە هەڵە ناگرن. هەرچەن کە بڕێک لە کوباییەکان هەن کە ڕەش بن. پیاو گوتی: جارێکیان لەگەڵ چینێک لە کوباییەکان سواری بەلەم بووە. بەلەمەکەی ئەو لە دورگەیەکی نیزیک باهاما ڕاوەستابوو کە کوباییەکان سوار بکات.

کاتێک پارێزەرانی قەراغی دەریان چوون بۆیان، کوبابیەکانی بۆ مەیامەی برد و ئەویشی بۆ هایتی گەڕاندەوە. ئێستا بە بەڵگەوە سواری بەلەمەکە ببوو کە پیشانی دەدا پۆلیسی هایتی بەدوایەوەن. هەروەها پاپێکی شکابوو کە ئیدی جێگای هیچ دوودڵییەک نییە.

خاتوونێکی بەساڵاچوو لە گەرماژەنی بوورایەوە. ئاو خوێم بەسەر لێوەکانی دا کرد هەوڵم دا دووبارە بیهێنمەوە سەرخۆ. ڕۆژانە کەش و هەوا زۆر گەرم دەبێ و بە شەویشا هەوا سارد دەبێ. چون ئاوێنەمان نەبوو سەیری یەکتریمان دەکرد لاوازی و نەخۆشی تا چ ڕادەیەک کاریگەری بووە.

بڕێک لە ژنەکان بۆ دامرکاندنی دڵ تێکەڵ بوونەکەیان گۆرانییان دەخوێند و بۆ یەک چیرۆکیان دەگێڕایەوە. منیش بەردەوام سەیری زەریام دەکەم. شەو کە دێت ئاسمان و زەریا دەبنە یەک. ئەستێرەکان زۆر گەورەو نیزیک دێنە بەرچاو.ئەوان لە زەریادا تیشکدانەوەیەکی زۆر جوانیان پێک هێنابوو. جار و بار هەستم دەکەم دەتوانم دەست درێژ کەم و ئەستێرەیەک بێنمە خوارەوە، بە وێنەی نانێک یان کولەکەیەک یان شتێک کە لەم سەفەرەدا بتوانین کەڵکی لێ وەرگرین.

کاتێک دەخوێنین هایتی ئازیز، هیچ کوێ نابێتە تۆ. پێش ئەوەی کە لێت تێبگەم دەبێت بەجێت بێڵم. بڕێک لە ژنەکان دەست دەکەن بە گریان. بڕێک جار منیش دەمهەوێت کە لە خوێندن بکشێمە دواوە دەست کەم بە گریان. بۆ شاردنەوەی فرمێسکەکانم، وا دەنوێنم کە دیسان دڵم لە بۆنی زەریا تێکڵ هاتووە. ئیدی لەگەڵیان ناخوێنم.

ڕەنگە تۆ هێندە هەواڵی ئەم پێش هاتانەت نەبێت. چونکە تۆ لە ماڵێکدا دەژیت کە بە یاساگەلی تووند گیراوە, ئەو دایکە بە مەکر و ئیفادەیەت، بەردەوام لە لێر چاوەدێری وردی باوکت بوویی. نا هەوڵم ئەوە نییە بە هۆی ئەمانە گاڵتەت پێ بکەم. گەر بکرێ شتێک بوترێ، دەڵێم شانازیت پێ دەکەم. گەر کچ بوایەم، ڕەنگە لە جیاتی لەدەرە

بوون و سیاسی کاری و تێک هەڵچوون لە چۆن شتێکا، لەماڵەوەدا دەبووم. دوو ڕۆژ کە لە زەریادا بی، بۆنی تەواوی ئەو ماسیيانەی کە تا ئێستا خواردووتە، بۆنی تەواوی ئەو قرژاڵانەی کە تا ئێستا گرتووتە، بۆنی تەواوی بووکە زەرياييەکان، کە تا ئێستاکە گازيان لێ گرتوويی، لێيەوە هەڵدەستێ. لەم بۆنە جاڕز بووم. لەو بۆنە گڵاوەی کە لەم مرۆڤانەی نێو بەلەمەکە هەڵدەستێ، هيلاک بووم. نازانم سليان، ئەو کچە دوو گيانە چۆن خۆی ڕادەگرێ. بەردەوام چاوی لە بۆشآيی ئاسمان بڕيوەو زگی دەماڵێت.

تا ئێستا نەم ديوە کە ئەو شتێک بخوات. کاتگەلێک ژنانی ديکە خوڵکی لەتێک نانێکی دەکەن و دەيگرێت، بەڵام خۆی هيچ خواردنێکی نييە. ناتوانم هەست کەم کە ئەم منداڵە کاتێک دێتە دونيا کە بە ئێجگاری برسيی بوويێت.

شەوێکيان بە قريشکەيەکەوە لە خەو داچڵەکا. هەستم کرد زگ ئێشەی گرتووە. لەو شوێنەی کە خەوتبوو خەريک بوو ئاو دەهاتە نێو بەلەمەکەوە. لە بنی بەلەمەکەدا قەڵەشێکی تێکەوتبوو، گەر گەورەتر ببوايە بەلەمەکەی دەکرد بە دوو کوتەوە. پاپۆڕوان هەمووی لادا و قەڵەشەکەی بە قير پڕ کردەوە. هەموو لێيان دەپرسی کە کێشەيەک نابێت، کە دەردەچن. ئەو گوتی کە هيواداره پارێزەری کەنارەکان بە زوويی بمان دۆزنەوە. بڕواکە کە دوای ئەو نەدەکرا بخەوی، ئەمە بوو کە هەمووان لە ژێر تريفەی مانگدا چاومان لە قيرەکە بڕيبوو. تا تاوکەوتن کارمان ئەوە بوو. بير و خەياڵ دامی گرتبوو کە ئەم قيرە تا کەی خۆ دەگرێت.

.........................................

باوکم شريتەکانتی دۆزييەوە، دەستی کرد بە دەنگ هەڵ بڕين بەسەرمدا و گوتی کە مەگەر داويەتی لەسەرم ئەوانەم هەڵگرتووە. ئەو تەنيا چاوەڕوانی هەڵگرتنی قەدەغەی بەکار هێنانی بێنزينە بۆ ئەوەی بتوانين لە شار بڕۆينە دەرەوە. چونکە ئەم

ڕۆژانە ناکرێ بە ماشێنەکەی بچێتە دەرەوە، بەردەوام گیر بە من دەدات. تەواوی کارخانەی ئامریکاییەکان بەستراون. ئەو بە هۆی شریتەکانەوە بەردەوام بەسەرمدا دەگوڕێنێت. ئەو خۆ پەرەست بانگمی کرد و گوتی: مەگەر نەتدیوە یان نەتبیستووە کە بەسەر ئەو سۆزانییە حەز پیاوانە وەک من چی دێت. من دەنگ بەرزەوە کراو گوتم: کە سۆزانی نیم.

ئەو ماقی ئەوەی نەبوو کە بەم شێوەیە بانگم بکات. ئەو بە هۆی بێ ڕێزی کردن پێی پاڵی لە منەوە نا و بە دیارەکەوە نووساندمی. تفی بە دەم و چاومدا کرد. بریا ماکوتەکان دەیان کوشت. بریا فیشەکێکیان پێوە دەنا کە بمزانیبایە چەندە دەترساوە. ئەو بە منی گوت، من ئەو گەمژەیەم لێ دوور نەکردوویی کە کێشەی بۆت دروست دەکرد. من دەستم کرد بە گوڕاندن بە سەریدا. بەڵێ، تۆ کردووتە. بەڵێ تۆ کردووتە، تۆ بەرازی دێهاتی. نازانم بۆچی ئەو قسەیەم کرد. ئەو زلەیەکی لێدام و بەردەوام تووند توونە زلەی دەوەشاند تا ئەوەکە مانمان هات و منی لە ژێر دەستی دەرهێنا. بریا یەکێک لەو فیشەکانە لە من دەدرا.

..............................................

جارێ کە قیر خۆی گرتووە. دوو ڕۆژ تێپەڕیوەو لە کونەکە هیچ هەواڵێک نییە. بەڵێ، ئاخری بووم بە ئەفریقایی. لە باوکت ڕەشتر بووم. ویستم کڵاوێکی قامیش لە یەکێک لە خاتوونەکان بکڕم، بەڵام بە دوو گوردی(6) کە بۆم ماوەتەوە پێمی نەفرۆشت. پرسی، بیر دەکەی پووڵەکەت لێرە بە کەڵکم دێت؟ جار وایە لە بیرم دەچێتەوە لە کوێم. گەر بەردەوام خەریکی خەیاڵ پڵاو بم، بە پیاسە لە بەلەمەکە دەڕۆمە دەرێی و دەورێک لێدەدەم.

شەوێک لە شەوان خەونم دی مردووم و چووم بۆ بەهەشت. ئەم بەهەشتە شتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو، لە بنی زەریادا بوو. دەور و بەرم پڕ بوو لە ئەستێرەو پەریی زەریا. پەریەکان سەمایان دەکرد و بە چەشنی قەشەکان لە مەراسمی قوربانی پیرۆز لە کلیسەی گشتی بە لاتینی ئاوازیان دەخوێند. تۆش لەگەڵ من لەوێ بووی، بنی زەریا. بنەماڵەت لەگەڵ بوو، ڕاوەستاو لە لەیەکەوە. باوکت بو شێوەیەک هەڵس و کەوتی دەکرد کە ڕەنگە باشتر لە ئەوانی دیکەیە و بەردەم ئەشکەوتی زەریایی ڕاوەستا بوو، پێشمی گرتبوو نەمدەتوانی بتبینم. هەوڵم دا قسەت لەگەڵ کەم، بەڵام هەر جار کە دەمم دەکردەوە، لێیەوە تۆقلە دەهاتە دەرێ. دەنگ بێ دەنگ.

..................................................

ئەم ڕۆژانە هەوڵێکیان دەس پێ کردووە. گەر بچنە نێو ماڵێکەوە و لەوێ دایک و کوڕێک ببن، سەری چەکەکانیان لە نێو چاویان دادەنێن و کوڕەکە ناچار دەکەن کە لەگەڵ دایکی بخەوێت. گەر باوک و کچێکیش ببن، هەر ئەو کارە دەکەن. بڕێک لە شەوەکان باوکم لە ماڵی براکەی مامە پرێسۆر دەخەوێت. مامە پرێسۆر لە ماڵی ئێمە دەخەوێت. بۆ ئاگاداری زۆرتر لە دەرکەوتنیان، بەم شێوەیە باوکم ناچار نابێت لەگەڵ من بخەوێت. لە جیاتی ئەو مامە پرێسۆر ناچار دەبێت. ئەم شێوەیەش زۆر خراپ نابێت. ئێمە کچێک دەناسین کە لەم ڕێگایەوە لە باوکی منداڵی بوو. باوکم بیشی کوژن نایەهەوێت چۆن شتێک پێش بێت. ئێستاش هەر بێنزینی فرۆشی نییە. گەر بوایە ئێستا لە ویڵ ڕۆز(7) بووین. باوکم هاوڕێیەکی هەیە کە دەیهەوێت لە ڕێگای سوپاوە بێنزینی بۆ وەدەس خات. هەر ئەوەی کە بێنزینمان دەس کەوێت، دەمانهەوێت خێرا ڕێکەوین تا ئەوەیکە شارستانییەتێک بدۆزینەوە. باوکم بەم شێوەیە دەڵێت، شارستانییەت. دەڵێ لە شارەکاندا هێندە بارودۆخەکە نالەبار نییە. من ئەمێستاکەش قسەی لەگەڵ ناکەم. خەیاڵ ناکەم ئیدی قسەی لەگەڵ بکەم. مانمان دەڵێ: تاوانی تۆ

نییە.  ئەو دەیهەوێت پارێزداری لە ئێمە باکت. ئەو توانای ئاگادار بوونی لە ئێمە نییە. تەنیا خودا توانای ئاگاداری کردن لە ئێمەی هەیە. ئەگەری هەیە چەکدارەکان بێن و هەرکارێک کە حەزیانە لەگەڵمان بکەن. ئەمە دەبێتە هۆی ئەوە باوکم هەست بە لاواز بوون بکات. ئەو لەم هەست بە لاوازییە تووڕە دەبێت. دەڵێم بۆچی لە من تووڕەیە؟ من کە یەکێک لەو بەرازە چەک بە دەستانە نیم. مانمان لە منی پرسی کە بەڕاستی چیت بۆ پێش هاتووە. گوتی دایک و باوکت پێش ئەوەی کە بڕۆن بۆ شارەکان دیوە. ئەوان نەیانویستبوو قسەیەکی بۆ بکەن. بە مانمانم گوت دوای ئەوەیکە هێرشیان کردە سەر بنکە ڕادیۆییەکە، بەلەمێکت گرت و هەڵاتی، بەلەمێکت گرت کە خودا دەزانێ بۆ کوێ دەچوو. ئەو گوتی:  ئەو کوڕە خەریک بوو پیاوێکی چاکی لێ دەردەچوو.  کوڕێکی تیژ بوو بە چەشنی نووکە دەرزییەک. لەم نزیکانە پێش هەمووان لە تاقیکارییەکانی زانکۆ بەشداری کرد. مانمان ڕێزی ئەو مرۆڤانە دەگرێت کە ئیرادەی گەورەیان هەیە. مانمان دەڵێ باوکم تۆی بۆ من نەدەویست چونکە وا پێ نەدەچوو بتوانی بەهرەیەک کە لەوەی ئەوان بۆ منی دەگەیەنن، بگەیەنی. ئەو دەیهەوێت پیاوێک بدۆزمەوە کە باشییەکی پێم بگات. کەسێک کە دڵگەرمیت دەدا لەوەی ئێستا هەتە زۆرترت پێ دەگات. لە ئێستادا تەنیا جوانی بۆ کچێک بەس نییە. ئێمە بە جوانی لەگەڵ کۆمەڵ پەیوەندمان نییە. پیاوێک کە باوکم بۆمی دەویت هیچاکت لەگەڵ من ڕووبەڕوو نابێت. مانمان دەڵێت:  ویستی دڵی هەرکەسێک، نەختێک ئەوینە، بە چەشنی دڵۆپێک لە پیاڵەیەکدا، ئەگە بتوانی وەدەستی خەی، یان تاڤگە، یان سێڵاو، گەر بتوانی ئەوانیش وەدەست خەی. ئەو دەڵێ، ئێمە هێندە پەیوەندی گەلی ئاستی بەرزمان نییە. بەم وەسفانەشەوە تۆ کچێکی خوێندەواری. هەرچەندە مانمان بۆ خوێندن بایەخێک دادەنێ کە بۆ کەسێکی دیکە جگە لە خۆمان هێندە گرینگ نییە. چاوەڕوان نەکراو نییە کە حەوتەی داهاتوو ئاکامی تاقیکارییەکانی زانکۆ بڵاو کەنەوە. دەرچوویێتی دەزانم. گوێ دەگرم ناوت ببیستم.

.................................................

زۆرتری دویکەمان بە چیرۆک گێڕانەوە تێپەڕاند. یەکێ دەڵێ کریک؟ دەڵێی کێرەک!(8) ئەوکات دەڵێ زۆرم چیرۆکی گێڕانەوەیی هەیە ، ئەوکات درێژە دەدات بە قسەکانی و چیرۆکەکانت بۆ دەگێڕێتەوە. بەڵام ئەوان ززۆرتر بۆ خۆی دەگێڕێتەوە، جاری وایە هەست دەکەی زۆرتری ئەو ساڵانەی وا ژیاوی لە زەریادا بوویی. ڕۆژ هەڵدێت و ئاوا دەبێت. بەم شێوەیە ئاگادار دەبیتەوە کە ڕۆژێک تێپەڕیوە. هەست دەکەم کە خەریکین بەرەو ئەفریقا دەڕۆین. ڕەنگە بە گوئینین(9) دەڕۆین بۆ ئەوەی لەگەڵ ڕەشاییەکان بژین. لەگەڵ تەواوی ئەو کەسانەی هاتوون بۆ لامان و مردوون. دوور نییە کە ئەوانیش لەوێ ڕێمان نەکەن. یەک کەس ڕادوێیەکی ترانزیستۆری هەیە و جار و بار گوێی بۆ ڕادوێ باهاما شل دەکەین. ژنێک دەڵێ لە باهاما لەگەڵ هایتییەکان وەک سەگ هەڵسوکەوت دەکەن. لە ڕوانینیانا ئێمە مرۆڤ نین. هەرچەندە موسیقاکەیان لە موسیقای ئێمە دەچێت. هەرچەندە هەردووکمان باوکانی ئەفریقاییمان بووە ڕەنگە بەیەکەوە لەم زەریایانەوە تێپەڕ بووبێتن.

دەتهەوێت بزانی خەلک لە بەلەمدا چۆن کاری دەس بەئاو دەکەن؟ ڕەنگە هەر بەو شێوەی کە لە کەشتی کۆیلەکاندا دەڕۆیشتن. بۆ ئەم کارە قەراغێکیان تەرخان کردووە. کاتێک کە کاری میزم هەیە تەنیا ئەو دەردێنم و بەسەر مێڵەکاندا دەنووشتێمەوە کارەکەم زوو تەواو دەبێت، بۆ ئەوەی دیکە لە شوێنێک شتێک دەپچڕێنم، دەترووشکێم و دوای تەواو بوون پیسییەکان دەخەمە زەریاوە. بۆنەکەی هەمووکات ئازارم دەدات. تررووشکان پێش ئەو هەموو مرۆڤە زۆر سەرشۆڕانەیە. خەڵک ڕویان وەردەگێڕن بەڵام نە هەمووکات. جار و بار لەخۆم دەپرسم، بەڕاستی ئەو پەڕی زەریا وشکی هەیە؟ ڕەنگە ئەم زەریایە کۆتایی نییە، وەک ئەوینی من بەرانبەر تۆ.

.............................................

دوێشەو هاتنە ماڵی مادام ڕۆژێر. هەر ئەوەی کە دەنگی قیژە و هاواری مادان ڕۆژێر بەرزەوە بوو. باوکم بە پەلە هاتە ژوورە. چەکدارەکان بەدوای کوڕەکەی دەگەڕان. مادان ڕۆژێر هاواری دەکرد کە ئێوە ئەوتان کوشت. سەریمان ناشت. دووجار کە ناتوانن بیکوژن. ئەوان هاواریان بەسەریدا دەکرد کە تۆ ئەندامی یەکێتی لاوان و ئەو بەرەڵایانەی ڕادوێی؟ ئەو دەنگی هەڵدەبڕی، بە ڕای ئێوە من شێوەم لە لاوەکان دەچێت؟ پرسیاریان کرد، هاودەستەکانی دیکەی کوڕەکەت دەناسی؟ باوکم ئێمەی ناچار کرد بڕۆینە دەرەوە بۆ ئاودەستخانەکەی پشتەوەی ماڵاوە. لەوێوە دەکرا هەموو شتێک ببیستی. بیرم دەکردەوە ئێستاکەیە کە هەناسەم لە بۆنی پیسابیەکان خەریکی گەنینە. ئەوان بەردەوام بەسەر مادان ڕۆژێر دەیانگوڕاند. کوڕەکەت ئەندامی یەکێتی لاوان نەبوو؟ ئەو نەبوو کە لە ڕادوێدا باسی پۆلیسی کرد؟ نەیوت مردن بۆ ماکوتەکان؟ نەیوت مردن بۆ ئەڕتش؟ گوتی ئەڕتش دەبێ بڕۆن، ئەو نەبوو کە دروشمی دەنووسی؟ ئەو لەگەڵ ئەم و ئەو کۆ دەبووە، نەیبوو؟ لە شەقامەکان خۆپیشاندانی دەکرد. تۆ دەبوا باشتر لەمانە ئامۆژگاریت بدایە. مادان ڕۆژێر دەستی کرد بە سووکایەتی کردن بە دایکیان. ئەو دەمی کردەوە و هاواری کرد، یاخوا لە گۆڕە نزا کراوەکانیان هێوەری نەبینن. ئەو بەردەوام هاواری دەکرد، ئێوە جارێک کوشتووتانە دەتانهەوێت منیش بکوژن؟ فەرموون. ئیدی بۆم گرینگی نییە، هەر ئێستاش من مردووم. نەشیاوترین کارەکانتان لەگەڵم کردووە. ڕۆحمتان کوشتووە. ئەوان تا دەیانتوانی دەنگیان بەرز کردبووە و بەردەوام درێژەیان پی دەدا: کوڕەکەت نیشتمان فرۆش بوو ناوی هاوڕێ نیشتمان فرۆشەکانمان پێ بڵێ. لە کۆتاییدا مادان ڕۆژێر بە دەنگێکی گڕەوە دەڵێ: بەڵێ بوو. ئەندامی ئەو گرووپە بوو، لە ڕادیۆ کاری دەکرد. لە خۆپیشاندانەکانی شەقام بوو. وەک من لە ئێوە بکوژەکان بێزار بوو. ئەوان

دەست دەکەن  بە کێشان بەسەریدا. دەتوانی دەنگی ببیستی. دەنگی ئەو چەکانەی کە بەسەری دا دێنە خوارەوە دەتوانی ببیستی. دەڵەی کە خەریکن تەواوی ئێسکەکانی ورد دەکەن. مانمان لە ژێر لێو بە باوکم دەڵێ ناتوانین لێرە بمێنین و ڕێگا بدەین کە بیکوژن. برۆ بڕێکیان پارە بدەیە، هەر وەک ئەو جارەی کە بە بۆنەی کچەکەتەوە ئەو کارەت کرد. باوکم دەڵێ:  تەنیا پارەیەک کە بۆم ماوە هەر ئەوەیە کە ئێمە بەیانی لێرە دەرباز دەکات.  مانمان لە ژێر لێوە دەڵێ:  ناکرێ لێرە بمێنین و بێڵین کە ئەو بکوژن.  مانمان تەکانێکی بە خۆی دا جۆرێک کە دەیهەوێت بچێتە دەرەوە. باوکم ملی دەگرێت و بە دیواری دەست بە ئاوەکەوە دەینووسێنێت. ئەو دەڵێ بڕیارە بەیانی بە ویل ڕۆژ بڕۆین. ڕۆیشتنی بنەماڵەت ناشێوێنی. ئێمە ناخەیتە ئەو هەل و مەرجە نەشیاوە. بە کوشتنمان نادەی. ڕۆیشتن بۆ ئەوێ وەکوو ئەوەیە مردوویەک زیندوو کەیتەوە. مانمان دەڵێ ئەو ئێستا نەمردووە، ڕەنگە بتوانین یاری بدەین. باوکم دەڵێ: بەزۆریش بێت ڕات دەگرم.  دایکم دەم و چاوی بە دیوارەوە دەنا. دەست دەکات بە گریان. دەتوانی دەنگی قیژەو هەرای مادان ڕۆژێر ببیستی. خەریکن لێی دەدەن. جۆرێک لێی دەدەن کە دەنگێکی دیکە نابیستی. مانمان بە باوکم دەڵی:  ناکرێ بهێڵی کەسێک بکوژن تەنیا لەبەر ئەوەی ترساوی.  باوکم دەڵێ:  بەڵێ دەکرێ بێڵی کەسێک بکوژن لەبەر ئەوەی ترساوی.  ئەوان بەڕێوبەری یاسان. ئێمە شارومەندێکی چاکین کە گوێڕایەلی یاساین. پێش ئەمە لە سەرانسەری ئەم وڵاتە ئەم شتە پێش هاتووە و ئەم شەویش لێرە پێش دێت و ئێمەش هیچ کارێکمان لە دەست نایات.

........................................................

سلیان تەواوی شەو ناڵاندی. ماوەیەکە توانای هەیە بەڵام ڕەنگە منداڵەکە لاساری دەکات. ئەو دەقیژێنێت کە خەریکە خوێنی لێ دەڕوات. ژنێکی بەساڵاچوو لێرەیە کە

لەوە دەچێت خۆی منداڵی زۆری بووە. دەڵێ:  سلیان خوێنڕێژی نییە، کیسە ئاوەکەی تەقاوە.

تەنیا منداڵانێک کە زوو دوای لە دایک بوون دیومە منداڵی مشک بووە. پێستیان بە ناسکی ڕووبەندێکە. تەواوی ئەندامەکانی و دەمارە خوێنییەکانیان دەبینرێ. هەمووکات حەزم دەکرد قامکمی تێ ڕۆکەم بزانم لێیەوە تێپەڕ دەبێت یان نا.

من بۆ لای دیکەی بەلەمەکە ڕۆیشتم بۆ ئەوەی چاوم بۆ جەرگ و دڵی سلیان نەکەوێت. خەڵک بەردەوام سەیر دەکەن، پاپووڕوانەکە بە ماماکە دەڵێ کە سلیان بێ تەکان ڕاگرێت کە بە جوڵەکانی لە بەلەمەکەدا کونی دیکە درووست نەبێت. جارێ سێ قەڵەشمان هەیە کە بە قیر پڕمان کردۆتەوە. دەترسم بەو کاتەی بیر کەمەوە کە دەبێت لە نێوان ئەوانی دەبێت لە بەلەمەکەدا بمێنن و ئەوانەی دەبێت بمرن دەبێت هەڵبژێرین. بوونی توانای وا کە ڕێگای بە چۆن بڕیارێک بدات، هەڵسوکەوتی هەمووانی هەروەها خۆمی کەلاکخۆر دەکرد.

تاو بە زوویی هەڵدێت. یەکێک دەڵێت ئەم منداڵەش زگێکی برسی دیکە. پیرەپیاوێک دەڵێت، کەمەکەی مەمکی دایکی هەیە. ئەمڕۆ هەموو دواهەمین بەشە نانەکەیان خوارد.

.....................................................

`قاو کەوتووە کە سەرۆک کۆمارە پێشووە کە خەریکە دەگەڕێتەوە. زۆر کەس کەوتوونەتە ڕێگای فرۆکەخانە کە ئەو ببینن. باوکم دەڵێ:  بڕیار نییە لە پڕتۆ پڕەنس بمێنییەوە کە بمانهەوێت بن چینەکەی دەربێنین کە ڕاستە یان درۆ. کڕین و فرۆشی بێنزین دیسان دەستی پێ کردوەتەوە. لە شەقامەکان کاروانی شادی کەوتبوونە ڕێ.

ئێمە لە ڕێگایەکی دیکەوە دەڕۆین، بەرەو ویڵ ڕۆز. ڕەنگە لەوێ شەوانە بتوانم بخەوم. ئێستا مانمان دەڵێ: بە گەڕانەوەی سەرۆک کۆماری پێشوو بارودۆخ باشتر نابێت. خەڵک هیوایەکی زۆریان هەیە، جاری وایە هیوا گەورەترین چەکێکە کە دژی ئێمە کەڵک وەردەگیرێت. خەڵک بڕوا بە هەر شتێک دەکەن. هیوا کە گەیشتە ئاستێک ئاستێکی، خەڵک ئیدیعا دەکەن کە بینیویانە کە مەسیح گەڕاوەتەوە و پشتاو پشت بەرەو سەلیب دەڕوات. مانمان بە باوکمی گوت: بەلەمت دەست کەوت. ئەم بەیانییە پێش ڕێکەوتنمان باوکم بە منی گوت: بە هۆی تەواوی ئەم پێش هاتانەوە بیر دەکاتەوە باوکێکی خراپ بووە. ئەو دەڵێ باوکێک دەبێت بتوانێ وەک پیاوێکی شارستانی لەگەڵ منداڵەکانی قسەکات. بەرودۆخی شێواوی ئێرە بووتە هۆی ئەوەی کە هەست بکات ناتوانێ. ئەو بێجگە لە ژیان هیچێکی ناوێت. لەو کاتەوە کە لە ئاودەست خانەکە هاتووینەتە دەرەوە ئەو و مانمان یەک وشە قسەیان نەکردووە. دەزانم باوکم لە ئێمە قینی نییە، نە لەو قینەی کە من لە چەکدارەکان و ماکوتییەکان و لە تەواوی ئەوانەی لێرە تەقە دەکەن هەمە. لە ڕێگامان بۆ ویڵ ڕۆز سەگ گەلێکمان دی کە دەم و چآوی دوو مردوو دەلێسنەوە. یەکیک لەوان کوڕێکی منداڵ کارە بوو کە لە تەنیشت شەقام درێژاو درێژ کەوتبوو و تاو لە چاوە کراوەکانی دەدرا. چەکدارێکمان دی کە ژنێکی پەل کێش کردبوو لە ماڵێک دەیهێنا دەرەوە و جادووگەر بانگی دەکرد. دەستی کرد بە تاشینی سەری ژن، هەرچەن کە ئێمە ڕانەوەستاین. پێش ئەوەی کە ڕێکەوین باوکم نەیویست بڕوات و سەرێک لە مادان ڕۆژێر بدات. خەیاڵی کرد کە ڕەنگە چەکدارەکان ئێستاش لەوێ بن. باوکم ماشێنەکەی بە خێرایی لی دەخوڕی. هەستم دەکرد خەریکە بە کوشتنمان دەدات. لەسەر ڕێگای لە پێش بازاڕێکی بەربڵاو(10) ڕاوەستاین. مانمان بۆ خۆی و بۆ من بڕێکی قوماشی ڕەش کڕی. ئەو قوماشەکانی دوو لەت کرد و بۆ سەرەخۆشی مادان ڕۆژێر لە دەوری سەرمان ئالاند. گەر خووم بە ویل ڕۆز گرت، ڕەنگە چەن شێوەی پەپوولەت بۆ سازکم، پەیوەندی بەو هەواڵانەیە وا بۆم دێنن.

........................................................

سلیان کچێکی بوو. ژنێک کە ئەرکی مامایيەکەی کێشا کۆرپەکەی بەرەو مانگ گرت و دۆعا دەکات. خودایە بۆ خۆت ئەم منداڵەت هێناوەتە دونیا، تکا دەکەم هەرچۆنێک کە پێت باشە لە تەواوی رۆژەکانی ژیانیا لەسەر زەوی. ئاگادار و ڕێنوێنی بە. کۆرپەکە ناگری.

ناچار بووین شت ومەکە زیادەکان لە بەلەمەکە فڕ بدەینە دەرێ. ئاو خەریک بوو خۆی دەکێشا نێو بەلەمەکە دەبوا بەلەمەکە سووکتر بێت. دوودانە گوردیەکەم دەبوا فڕم بدایەتە دەرەوە، پێشکەشییەکە بۆ ڕۆحی ئاوی ئاگویێ(11). دوێکە بیستم پاپۆڕوانەکە بە کەسێکی دەوت ڕەنگە پێویست بێت لەگەڵ ئەوانەی کە گێژی زەریایەکانیان چاک نەبووە کارێک بکەین. دەترسم کە لە منیان بوێت بەرگەی تێبینییەکانم فڕێ بدەم. بۆ پێشگیری لە نوقم بوونمان ڕەنگە هەمووومان ناچار بین ڕووت بینەوە.

منداڵی سلیان جوانە. خەریکن ئەو سوئیس بانگ دەکەن. چون لەسەر چەقۆیەک کە ناوکیان بڕی بوو نووسرابوو سوئیس. گەر ئەو کچی من بوایە ناویم دەنا سۆلیل(12). یان خۆر، مانگ، یان ئەستێرەم دەنا، لە سەر پێکهاتە سرووشتییەکانەوە. ئەو ئێستاکەش ناگریت. سەبارەت بە چۆن پڕ بوونی زگی سلیان قاوێک بڵاو بووەتەوە. چەنێک دەڵێن کە لەگەڵ پیاوێکی ژن دار کەین و بەینی بووە و باوک و دایکی لە ماڵەوە کردوویانەتە دەرەوە. قاو لیرەش وەکجێگاکانی دیکە بڵاو دەبیتەوە.

لەبیرت دێ چ خەیاڵ گەلێکی خاومان دەکرد؟ دەرچوون لە تاقیکاری زانکۆ و ئەوکات کەرخوێنییەک کە تا بێنەهایەت بڕۆین، لە زانکۆ هێندە بەرەو پێش بچین کە جێگای هەیە. دەزانم کە ڕەنگە باوکت هیچکات من قەبووڵ نەکات. بڕیارم وابوو کە هەوڵ

بدەم بەسەریا سەرکەوتوو ببم. گەر ئەو دەیهەوێت پێشی ئەوینی من بە تۆ بگریت. دەبێت دڵم لە سنگەوە دەربێنێت. بریا هەر ئەو جۆرەی کە بەڵێنت دابوو بنووسی. یا عیسا مەسیح، یا مریم، یا یوسف! ئێرە هەموو شتێک بۆنێکی پیسی گرتووە. بەیەکەوە دەمە دەمێ دەکەن و دەڵێن: تەنیا بەختی خراپ دەتوانێ من لەگەڵ تۆی دۆڕاو لە شوێنێک کۆکاتەوە. بیری لێ بکەوە. ئەگەری هەیە هەمووومان وەکوو پەڕە کایەک نوقم بین، لە کاتێکدا کە کەوتووینەتە گیانی یەک کە کێ لە کێ باشترە.پیرەپیاوێکی بێ ددان هەیە نووشتاوەتەوە بزانێ چی دەنووسم. ئەو مژی لە ئاخری پیپە دارینە کۆنەکەی دەدا کە ساڵانێکی دوورە ئاوری بەخۆی نەدیوە. شێوەی نگارەیەک دەدات. بە سادەترین شتەکان، بە دیمەنەکان، دەکرێ مۆزەخانەیەک پڕ کات. ئێستاش لە هەڵاتنێک کە کردم هەست بە خوێڕێتی دەکەم. هیچ هەواڵێکت لە دایک و باوکم هەیە؟ دواهەمین جارێک کە لە کەنارەکانی زەریا دییانم دایکم کریزی(13) بەدەستەوە بوو. لەسەر لمەکان بوورایەوە. هەر ئەوەی کە ڕێکەوتین ئەوم بیینی کە بەرەو لامان دێت، هەرچەن هەواڵم نییە ئێستا هەموو شتێک لەسەر جێی خۆی بێت.

ئاو بەردەوام خەریکە دێتە نێو بەلەمەکە. بەنۆرە کاسە کاسە دەیکەینەوە دەرێ. نازانم چ شتێک ڕێگیری دوو لەت بوونی بەلەمەکەیە. سوئیس ناگری. بە بەری دەست دەیدەن بە پشتی دا بەڵام ناگریت.

.........................................................

ئاشکرا بوو کە سەرۆک کۆمارە پێشووەکە نایات. ئەژمارێکی زۆریان لە فڕۆکرخانە دەست بەسەر کرد. بەرەو زۆر کەسیش تەقەیان کرد و بەسەر زەوییان دان. من لە ڕادوێ بیستم. ئەمشەو کاتێک شێومان دەخوارد بە باوکمم گوت: خۆشم دەوێی. نازانم گەر جیاوازییەکی هەبێت یان نا. تەنیا ویستم بزانێت کە لە ژیانما کەسێکم خۆش

ویستووە. گەر ڕووداوێک بۆ یەکێک لە ئێمە پێش بێت. گومان دەکەم باشترە سەبارەت بە من ئەمە بزانێت کە لە ژیان، جگە لە دایک و باوک، کەسێکی دیکەشم خۆش ویستووە. دەزانم تۆ ئاگادار بووی. دەربڕینی ئەم هەمووە هەستە بێگەرد و پاکە بۆ کێ باشتر لە تۆ؟

تەنیا دەمویست ئەو بزانێت کە دەتوانم کەسێکم خۆش بویت. ئەو چاوەکانی لە چاوم بڕی و هیچی نەوت. هێندەم خۆش دەوێی کە لە بیری ئەوەی شتێکت بۆ پێش بێت موچڕکم پێدا دێت. باوکم تەنیا نیگای وەرگێڕا، هەر دڵێی بوونم نییە. خەریکم لە بن دار هەنجیری پەرستگەی ماڵە نوێکەمانەوە بۆت دەنووسم. ماڵەکە تەنیا دوو ژووری هەیە و بانێکی تەنەکە کە کاتێک باران دێت دەست دەکات بە ژاندن، بەتایبەت کاتێک تەرزە دەبارێت دەڵێی کە لە ئاسمان تووڕانە فرمێسک دەڕژێت. لە تەپەیەک کە ماڵەکەی لە سەرە جۆگەیەکی پێدا دەڕوات، جۆگەیەک کە بۆ من زۆر قووڵ نییە بۆ ئەوەی خۆمی تێدا نوقم بکەم.

مانمان و من بۆ قسە کردن لە بن دار هەنجیری پەرستگەکان زۆرمان کات دانا. ئەو ئەمڕۆ بە منی گوت کە دەبێت کاتگەلێک لە نێوان باوکی و پیاوێک کە خۆشی دەوێت یەکیان هەڵبژێرێت. تەواوی ئەندامانی بنەماڵەی دژی شوو کردنی ئەو و باوکم بوون، بەو هۆیەی کە باوکم باخەوانێکی وێڵ ڕێزی بوو بەڵام بنەماڵەی مانمان شاری بوون و تەنانەت چەنێکیان زانکۆ چبوون. بۆ ئەوەی کە نەکا باوکم پێی گران بێت، ئەو هەمووکات لە ژێر دار هەنجیری پەرستگەکان لە ژێر لچەوە قسەی دەکرد. دیم باوکم زۆر نالەبار لە ماڵەوە سەیرمان دەکات. بیستم قوڕگی ساف کرد کاتێک گوتت قسەکانی ئێمەی بیستبێت، گوتت زۆر پێی گران بووە کە بەیەکەوە دانیشتووین.

سلیان ڕاکشاوە و سەری ناوە بە کەناری بەلەمەکەوە. کۆرپەکەی ناگریت کە ناگریت. لە نێو ئەو هەموو شیوانەدا هەردووکیان زۆر ئارام دێنە بەرچاو. سلیان کۆرپەکەی توووند بە سنگیەوە نووساندووە. دوور دێتە بەرچاو کە خۆی ڕازی بێت کە منداڵەکەی بخاتە ئەقیانووسەوە. سەبارەت بە باوکی منداڵەکە پرسیارم لێی کرد. بە چاوە بەستراوەکانیەوە پێش هاتەکەی بۆ گێڕامەوە، لێوەکانی بە دژواری دەجووڵاندەوە.

شەوێک لەگەڵ دایک و براکەی لیۆنێل لە ماڵەوە بوون کە لەناکاو دە چەکدار دێنە ژوورەوە. چەکێک دەنێن بەسەر لیۆنێڵەوە ئەمری پێ دەکەن کە ڕاکشێت و لەگەڵ دایکی نزیکی بکات. لیۆنێل ژێر باری قسەیان ناچێت. دایکی داوا لە لیۆنێل دەکات کە دژایەتییەان نەکات و گوێ ڕایەلی قسەی چەکدارەکان بێت. چون دایکی دەترسیت گەر لیۆنێل بیهەوێت زۆرتر لەمە بەربەرەکانێ بکات ئەوان خێرا دەیکوژن. لیۆنێل گوێ بە قسەی دایکی دەدات، ئەو دەگری و چەکدارەکان پێی پێدەکەنن و لوولەی چەکەکانیان لە ملی ڕۆدەکەن.

دواتر چەکدارەکان لیۆنێل و دایکی دەبەستنەوە، ئەوکات بە نۆبە دەستدرێژی دەکەنە سەر سلیان. کارەکەیان کە تەواو دەبێت  بە لیۆنێل تۆمەتی تاوانی ئەخلاقی دەگرن. لە ئەو شەوە تا ئێستا سلیان هیچ هەواڵێکی لە لیۆنێل نییە.

هەر ئەو شەوە سلیان دەموچاوی بە تێخ دەبڕێت کە ئیدی کەس نەیناسێتەوە. دوای ئەوەیکە برینەکانی چاک دەبنەوە زیبکە دەردەکات و حاڵی خراپ دەبێت. دواتر ئاگادار دەبێت کە خەریکە گەورەدەبێت. ئەم بەلەمە دەدۆزێتەوە و سوار دەبێت. ئەو پازدە ساڵی بوو.

.........................................................

ئەمڕۆ مانمان تەواوی بەسەرهاتەکەی لە ژێر دار هەنجیرەکەی پەرستگەکان بۆمی گێڕایەوە. حەرامزادەکان خەریک بوو دەهاتن من بگرن. دەیانویست دەست بەسەرم کەن. دەیانویست بیانوو بێننەوە ئەندامی یەکیتی لاوانم و ئەوکات من ببەن. ئەمە گەیشتەوە بە گوێی باوکم. ئەو دەچێت بۆ مەکۆکەیان و پارەیان دەداتێ. تەواوی پارەکانی. ئەو تەواوی ماڵەکەمان لە پڕتۆپڕەنس و تەواوی میراتییەکانی دەدات، ئەو تەواوی ئەوانەی لە دەست دا بۆ ئەوەی گیانم ڕزگار کات. بەو بۆنەیەوە زۆر تووڕە بوو. ئەمشەو مانمان لە ژێر دار هەنجیری پەرستگەکان ئەمەی پێم وت. وشەیەکم بۆ سپاس لە باوکم نییە. نازانم بە چ شێوەیەک دەست خۆشی لێکەم. مانمان دەڵێ، بە هۆی ئەمەوە خۆشت بوێت، دەبێت. هێچکات ناتوانی لە خۆبردوویەک کە ئەو کردوویەتی لە یاد ببەی. من توانای سپاس کردن لە باوکم لە خۆمدا نابینم. ئێستا ئەو بۆ من شتێک زۆرتر لە باوکە. ئەو پیاوێکە کە هەموو شتێکی دا کە من ڕزگار کات. ئەمشەو لە ڕادوێ ڕیزبەندی ناوی دەرچووەکانی تاقیکارییەکانی زانکۆیان خوێندەوە. دەرچوویی.

.........................................................

ئاوی زەریا بڕێک داڵدەمانی داوە. پاپۆڕوانەکە کەڵکی لە ماوەی قیرەکە وەرگرت. ماوەیەکە ئاوێکی کەمتر دێتە نێو بەلەمەکەوە. زۆریان خوازیارن منداڵەکەی سلیان بخەنە دەرەوە. ئەگەری نییە ئەو ڕێگایان بداتێ. ئەوان چاوەڕوانن بچێتە خەوەو ئەم کارە بکەن. بەڵام ئەو خەوی لێ نەدەکەوت. بەر لەمە هیچ کات نەمدەزانی کە منداڵە مردووەکان بەنەوش دەبنەوە. بەو هۆیەی کە پێستی کۆرپە زۆر ڕەشە لێوەکانی لە هەموو شوێنێک بەنەوشترە. بەنەوشییەکەی بە زەریای دوای ڕۆژاوا بوون دەمێنێت.

سلیان وردە وردە خەریکە خەوی لێ دەکەوێت. منداڵ بوونی هیلاک و بێزاری کردووە. من کە نامهەوێت دەست بدەم لە منداڵ. گەر بڕیار بێت کەسێک منداڵەکە بخاتە نیو ئەقیانووس، بیردەکەمەوە باشتر وایە خۆی ئەم کارە بکات. بەردەوام بیر دەکەمەوە کە ئەوان هەر لەتە گۆشتێکی کە دوای لە دایک بوونی کۆرپەکە لە لەشی دایکەکە دەرهێناوە لە نێو ئاویان خستووە. دەیانهەوێت منداڵی مردوو لە نێو ئاو بخەن. ئەمانە سەماسی بۆ لامان ڕاناکێشێت؟

شوێنی قووڵی قامکەکانی سلیان بە پشتی منداڵەکەوە ماوە. پیرەپیاوە پیپییەکە دەپرسێت: برام، چی دەنووسی؟ دەڵێم: وەسیەت نامەکەم.

..................................................

خەریکم بە ویڵ ڕۆژ خوو دەگرم. لێرە پەپوولە هەیە، باوەش باوەش. جارێ کە هیچکامیان لەسەر دەستم نەنیشتوونەتەوە، یانی هەواڵێکیان بۆم نییە. ئاوی جۆگەکەی نزیکی ماڵمان زۆر ساردە، بۆ ئەوەیە ناتوانم هەمووکات لەوێ خۆم بشۆم. تەنیا نیوەڕۆیانە کە ڕەنگە کاتێکی بەجێ بێت، کە ئەوکاتیش ڕەنگە زۆر چاو خۆ شۆردنەکەم ببینێت. کێشەکەم ئاوا جێ بەجێ کردووە، بەیانیان سەتڵێک ئاو هەڵدەگرم و ئەویش لە ژێر تاو دادەنێم تاریک کە بوو لە بن دار هەنجیری پەرستگەکان خۆم دەشۆم. ئێستا دار هەنجیری پەرستگەکان جێی بڕواترینن هاوڕێمن. دەڵێن دارهەنجیرەکانی پەرستگەکان سەدان ساڵ تەمەن دەکەن. تەنانەت لق وپۆی شۆڕ بووەکەیان دەتوانن ببنە دار. مانمان دەڵێ: گەر بێڵن، دار هەنجیرێک دەبێتە دارستانێک. لە شوێنێکەوە کە لە ژێر دار هەنجیرەکەوە ڕاوەستاوم دەتوانم کێوەکان ببینم و لە پشت ئەوانەوە کێو هەیە. کێو گەلێکی زۆر کە بە چەشنی شاخەکان پەتین. هەست دەکەم تەواوی ئەو کێوانە من لە تۆ دوور و دوورتر دەکەن.

.............................................

سليان منداڵەکەی لە بەلەمەکە خستە دەرەوە. دەموچاویم دی کە وەک پەتێک کە گرێ پووچکەی تێکەوت و ئەوکات بەری دا. شڵپ دەنگی دا، ماوەیەک لەسەرەوە ماوە و ئەوکات  کەوتە بن. سلیانیش دوای ئەو خێرا خۆی خستە ئاوەکەوە. سەری منداڵەکە کە بن کەوت سەری سلیانیش وەبن کەوت. ئەوان بە چەشنی دوو بتری لە ژێر تاڤگە بەیەکەوە ڕۆیشتن. پەشۆکاوی ئێمەش هەر هێندەی درێژ خایەند. تەنانەت کاتێک بۆ هەوڵ بۆ ڕزگار کردنی نەما. نەدەکرا کارێک بکەی. زەریا بە چەشنی سەماسییەک بوو کە لەوێ دەژیا. بەزەیی نییە.

دەڵێن دەبێت دەفتەرەکەم فڕ بدەم. پیرەپیاوەکەش دەبێت کڵاو پیپەکەی فڕ بدات. ئاو دیسان خەریکە دێتە سەرەوە و خەریکن مشت مشت دەیکەنە دەرەوە. چەن ساتێک کاتم ویست بۆ ئەوەی پەڕە کۆتاییەکەی بنووسم و بەڵێنم داوە دەستی لێ هەڵگرم. دەزانم ئەگەری هەیە هیچکات نەیبینی، بەڵام خەیاڵ دەکەم کە لێرەی و دەتوانم لەگەڵت قسە بکەم.

بریا دایک و باوکم زیندوو بن. لە پیرەپیاوەکەم ویست گەر دەرباز بوو پێیان بڵێت کە چی پێش هاتووە. ئەو دەیهەوێت ناوی لە کتێبەکەما بنووسم. ناوی بە تەواوەتی دەپرسم. ناوی ژۆستین مووئاس ئاندرێ نۆزیووس ژۆزێف فڕانک ئۆسناک ماکسیمیلیانە. هەمووی ئەمانەی بە چۆن گورێکەوە دەڵێ بیر دەکەیەوە پاڕشایەکە. پیرە پیاو دەڵێ:  دەزانم کە کەشتییەکی پارێزەرانی کەنارەکە بەڕێگاوەن. هاتووەتە خەوم.  ئەو ئاماژە بە شوێنێکی دوور دەکات. سەیری شوێنێک کە ئاماژە دەکات دەکەم. هیچێک نابینم. لێرەوە کەشتییەکان وەک تراویلکەی بیابانن. ئیدی دەفتەرکەم

دەخەمە نێو ئاوەکە. دەفتەرەکە بەرەو ئەوان دەڕوات، بەرەو سلیان و کچەکەی و تەواوی ئەو منداڵانەی زەریا کە ڕەنگە بەزوویی داوام کەن.

ئیدی خەریکم دەچم بۆلایان، دەڵێی چارەنووس بووە، دەڵێی ڕاست لە هەوەڵ ڕۆژەوە کە دایکم منی بوو ویست بووی من لە نێوان منداڵانی زەریای قووڵی شین، ژیانی پاش کۆتاییم بێت، لە نێوان ئەوانەی کە لە زەنجیری کۆیلەتی هەڵاتوون بۆ ئەوەی لە ژێر ئاسمان و زەوی لە خوێن کێشراو، جیهانێک ساز کەن.

ڕەنگە لە سەرەتای درووست بوون چارەنووسم ئەوە بووە کە لەگەڵ ئاگوێ لە قووڵایی زەریا بژیم. رەنگە بۆ ئەوە بووە خەوی ئەستێرەی زەریاو بووکیی زەرياییم دەبینی کە لە بنی زەریا عەشای ڕەبانیی یان گرتووە. ڕەنگە ئەمە بانگهێشتێک بۆ ڕۆیشتنم بوو. هەرچێک پێش بێت، دەزانم ببم بە منداڵی زەریا، یادی تۆ لەوێش لەگەڵم دەمێنێت.

................................................

ئەمڕۆ سپاسم کرد. گوتم باوکە لەوەی کە ژیانمت پاراست، سپاست دەکەم. ئەو پرتەو بۆڵەیەکی کرد و بەدەست دای بە شانەما و دەستی وەک پەپوولە زوو لابرد. ئەوکات پەپوولەیەکی ڕەش پەیدا بوو کە لە دەور و بەرمان دەفڕی. بۆ ئەوەیکە نەتوانێت لەسەر دەستم بنیشێتەوە دەستم کرد بە هەڵاتن بەم لاو لادا، بەڵام چی بکەم کە هەواڵەکەی لەگەڵ خۆی هێنابوو. دەمزانی کە دەتوانێ چی پێش هاتبێت. ئەمشەو لە ژێر دار هەنجیری پەرستگەکان گوێم بە ڕادوێ تڕانزیستۆریەکە دەدا. تەنیا شتێک کە لە ڕادوێکە دەبیستم کوشتارەکە زۆرتر لە پڕتۆپڕەنسە. بەرازەکان دەست هەڵگرن نین. نازانم چی پێش دێت، بەڵام ناتوانم بیری لێ بکەمەوە کە بمانهەوێت هەموو کات لێرە بمێنین.

خەریکم لە ژێر دار هەنجیری پەرستگەکان بۆت دەنووسم. مانمان دەڵێ: دار هەنجیرەکانی پەرستگەکان پیرۆزن و جاری وایە گەر لە ژێریان بانگی خوداوەندەکان بکەین، دەنگمان ئاشکراتر دەبیستن. ئێستا ئیدی پەپوولەکان هەمووکات لە دور و بەرم دان، پەپوولەگەلێکی ڕەش کە ناهێڵم دەستم بدۆزنەوە. بەردی گەورەیان بۆ فڕ دەدەم، بەڵام ئەوان زۆر ئازاترن. دوێشەو لە ڕادوێ بیستم نزیکی کەنارەکانی باهاما بەلەمێکی دیکە نوقم بووە. ناتوانم بیری لێ کەمەوە کە تۆ لەوێ لە نێوان شەپۆلەکان بیت. قژەکانم لەرز دەکەن. لێرە، تەنانەت ناتوانم زەریا ببینم. پشتەوەی ئەم کێوانە، کێوگەلێکی زۆرتر هەیە و پەپوولەی ڕەشی زۆرتر و زەریای بێ بڕانەوە بەچەشنی ئەوینی من بۆ تۆ.

1- هایتی وەک هەر ئەوکاتە کە ڕۆیشتی هیلاکە.

2- جۆرێک سیحر و جادووە لە ئایینی هۆدۆ، لو وڵاتانی سنووری کارائیب.

3- بەندیخانەی مەرگ، خرابترین بەندیخانەی سیاسی، یان ئەشکەنجە خانەیەک لە سەردەمی دەسەڵاتی دووالیر لە ساڵەکانی1957-1986

4- madan roge

5- macoutes- یان بە ناوی تەواوی tonton macoutes, هێزی ئەمنی تایبەت کە لە ساڵی 1959 کە بەدەستی سەرۆک کۆماری هایتی، فرانسوا دووالیر، بە لاسایی کردن لە کراسە ڕەشەکانی ئیتالیای فاشیست، یان مۆدێلی گەورەتری کراس قاوەییەکانی ئاڵمان بونیاد نران. ئەم هێزە شێوە چەکدارییە لە ساڵی 1971 بەە فەرمی

ناوی گۆڕا. Mvsn هێمای کورت کراویەتی. ماکوتەکان بە چاویلکە ڕەش و هەڵواسانی قوربانییەکانیان لە شوێنە گشتی بۆ ئاگاداری کەسانی دیکە بەناوبانگ بوون.

6- .gourd بونیادی پارەی هایتی.

7- ville rose

8- !krik?krak ئاماژەی هەیە بە نەریتی چیرۆک گێڕانەوەی هایتی. بانگەشەیەک بۆ بە قسە هێنان ئامادە کردنی بەردەنگەکانی بۆ چیرۆک گێڕانەوەو بیستن.

9- Guinin

10- open market

11- agwe

12- ,soleilبە فەڕانسە بە مانای هەتاو.

13- kris جۆرێک کالانی کەوانی شێوەی باریک. بنەڕەتی ئەم کالانە مالیزیاییە و سەبارەت بەو بڕوایێک بوونی بووە بەم مانایە بڕێک لە کریسەکان لە ئاورکەوتنەوە، مردن، بێبەختی لە کشت و کاڵ و هتد بەرگری دەکەن. لە لایەکی دیکەوە کریسەکان دەتوانن بۆ خاوەنیان بەخت بێنن و هێزی کوشەندەی زۆریان بێت. هەروەها ئەم بڕوایە بوونی هەبووە کە کریس توانای هەیە لەسەر دەندووکی ڕاوەستێ، گەر خاوەنەکەی ئەو بەناوە ڕاستییەکەی بانگ کات.

14- kompe